# ناوەڕۆك

## پێشەکی

لە  سەراز سەری جیهان لە هەموو  شوێنێك کەلی سا و مزگەوت و پەرە ستگا دەبینرێت، ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئایین بۆ مرۆڤەکان زۆر بەنرخە. مەسـیحیەت یەکێکە لە ئایینە گرینگەکان. بەڵام، ئەم ئایینە دابەش کراوە بۆ چـەند مەزهەبێکی گەورە. لە سـەدەی شـانزەهەم دابەش بوونێکی گەورە ڕوویدا، واتە بزوتنەوەیەك کە بە (ڕیفۆرمەیشـن) یان چـاکسـازی بەناوبانگە، و مەودایەکی خستنە نێوان مەسیحیەتی کاتۆلیك و پرۆتستانت. ئەم بزوتنەوەیە بۆیە پێی وترا چاکسازی بۆ ئەوە بوو کە  چاکسازی لە کەلیسادا بکرێت و با شتری بکەن. بە تایبەت  سی کەس ئەم کارەیان دە ست پێ کرد و پشکێکی زیاتریان لەم چاکسازییە هەبوو کە ئەوانیش بریتی بوون لە: لوتەر، ئیراسموس و لوایولا.

کەلیسای نوێی پێترسی قدیس، ئەم کەلیسایە لە سەر دیزانێکی نوێ دروستکراوە.

## کەلیسا لە ساڵی ١٥٠٠

بەر لەوە تا سـاڵی ١٥٠٠ دابەش بوونێکی گەورە لە کەلیسـا ڕووی دابوو. پاپ کە لە ڕوما دەژیا خۆی بە سـەرگەورەی هەموو کەلیسـاکان دەزانی و خەڵکی ئەوروپای ڕۆژئاواش ئەوەیان پەسـەند کردبوو. بەڵام زۆرێك لە مەسـیحیەکانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات (پاتریارکی) قوسـتەنتەنیەیان( ئەسـتەمبوڵی ئیسـتا ) بە ڕێبەری خۆیان دەزانی. کەلیسـای ئەمانە بە کەلی سای ئۆرتۆدۆکس دەنا سرا. گەر چی هێزی پاپ لە  ساڵی ١٥٠٠ زۆر بوو بەڵام لە  چاو پێ شتر دە سەڵاتی کەمی

**کردبوو. بە درێژای سەدەی پێشتر پاپەکان لە گەڵ ئیمپراتۆرەکان لە سەر دەسەڵات جەنگی خوێناویان هەبوو. لە کۆتاییدا هیچ کامیان سەرکەوتوو نەبوون. سەرەنجام بە سوودی فەرمانڕەواکان کۆتایی پێ هات. ئەم فەرمانڕەوایانە لە گەڵ هەر دوولا خۆیان دەگونجاند، و هەوڵی نابوودکردنی هەردوولاشیان دەدا بۆ بەهێزترکردنی پێگەی خۆیان.**

**جولیو سی دووەم، کە لە ساڵی ١٥٠٣ پێگەی پاپی بەدە ست هێنابوو، کاردینال بوو، کە شیش( ئو سقۆف) بوو زیاتر لە حەوت جار بوو کە بە ئۆسقۆف هەڵبژێردرابوو، زیاتر لە دوو جار بوو ببوە سەرۆکی دەیر( صومعە)، هەڵبەت هەموو ئەم پێگانەی لە یەك کاتدا هەبوو. گەورەترین ئارەزووی ئەوەبوو ماڵ و موڵکەکەی لە ئیتالیا زیاتر بکات. هەندێك لە سەرانی کەلی سا ئەو خاڵەیان بەلاوە ئا سانتر بوو کە هەر ڕەفتارێکیان هەبێت کێ شە نییە، بە مەرجێك ئادابەکانی کەلی سا بە جێ بهێنن. زۆرێك ئەم خاڵەیان بەلاوە پەسەند بوو، چونکە تاقەتی دەردەسەری گۆرانکاری ژیانێکی هاوڕای داواکاری مە سیحیان نەدەویست. خەڵکی بۆ ئەوەی داوای لێخۆش بوون لە خوداوەند بکەن، خۆیان دەخستە پاڵ هەندێك دە ستەو ڕێکخراوی دینی، و زیارەتی شوێنە پیرۆزەکانیان دەکرد و هەندێك ڕەفتاریان لە خۆیان نی شان دەدا بە بێ ئەوەی بیر لە مانای ڕا ستەقینەیان بکەنەوە. ئەم هەڵانە نا شاردرێننەوە، هەندێك دەیانهەوی ست گیانێکی دیکە ببەخ شنەوە بە کەلی سا و یەکێك لەو جۆرە کەسانە، ئیراسمۆس بوو.**

## دیزیدریۆس ئیراسمۆس

**ئیراسموس لە بنەماڵەیەکی قەشە لە ساڵی ١٤٦٦ لە نزیك رویترادم، لە هۆڵەندا لە دایك بوو. لە تەمەنی نۆ ساڵی چووە قوتابخانە، گەرچی لەوێدا شتێکی وای فێر نەبوو، بەڵام لەوە تێگەشت کە ئا شقی فێربوونی زانستە. تەمەنی ١٣ ساڵ بوو کە دایك و باوکی بە هۆی نەخۆ شی تاعونەوە مردن. هەندێك میراتی بۆ مابویەوە. سەرپەرە ستەکانی کە ئیتر هیچیان لە دە ست نەدەهات هانیان دا کە بچێت بۆ خانەقا ( صومعە). شەش ساڵی خەمناکی لەوێدا بە سەر برد. بۆی دەرکەوت کە کاتێکی زۆری بە هۆی دۆعا کردن، بە ڕۆژوو بون و بەجێهێنانی ئادابەکان بەسەر دەبات. بەڵام ئەم چوونە خانەقایەش سوودێکی تری هەبوو بۆی، ئەوەش ئەوە بوو کە توانی کتێبی زۆر بخوێنێتەوە و زانستی زیاتر بێت. ئەوەندە بە چاکی ئەم کارەی ئەنجام دا کە (قەشە کامبرای) کردیە یاردەدەری خۆی. ئیراسمۆس خۆشحاڵ بوو کە توانی خانەقا جێبهێڵێت و ئیتر نەگەڕایەوە ئەوێ. ماوەیەك دواتر هەمان قەشە داوای لێکرد کە بچێت بۆ پاریس و لەوێ خۆێندنی زانکۆ تەواو بکات. ئیراسمۆس لەوێ هە تا توانی (زانستی نوێ)ی خوێند.**

**ئیراسموس**

**چاپخانەی سەدەی شانزەهەم. نووسنی ژێر وێنەکە باس لەوە دەکگات: کە چاپ دەنگێك دەگەیەنێتە گوێی زۆر لە خەڵك و بەرگێك کتێب دەکاتە هەزاران بەرگ.**

## زانستی نوێ

**ئەم سەدەیە بۆ کەسانێك کە بە دوای زانستەوە بوون سەدەیەکی ووروژێنەر بوو. ڕێنسانس کە لە ئیتالیاوە دەستی پێکردبوو، هەموو ئەوروپای گرتبووەوە. ڕێناس واتە (دووبارە ژیانەوە)، زاناکان و هونەرمەندانی ئەم سەدەیە چاویان لە ڕابردوو بوو، واتە سەردەمی یۆنان و ڕۆمی کۆن. لە کتێبخانەکان لە دووی بەڵگەنامە دەگەڕان و شوێنە ڕوخاوەکانیان هەڵدەکەند بۆ ئەوەی ئاساری بینا و پەیکەرتاشی کۆن بدۆزنەوە.**

**ئەو زانایانەی کە لە یونانەوە هەڵدەهاتن ئەوان باوەشیان بۆ دەکردنەوە و زۆر جار ئەو زانایانە کتێبانێکی دەستنووسی بەنرخیشیان لە گەڵ خۆیان دەهێنا کە بۆ ڕۆژئاوا تازە بوو، ئەمانە لەبەر ئەوەی لە یونانەوە هەڵدەهاتن کە تورکەکان لێیان نزیك دەبوونەوە. زۆرێك لە هونەرمەندان کەڵکیان لەم بەرهەمانە وەرگرت و لیکۆڵینەوەکانی خۆیان پێ بەرنرخ تر کرد( بنوارە داڤینچی هەر لەم زنجیرەیە) و زۆرێك لە دانایان توانیان هۆشیاری خۆیان زیاد بکەن بە هۆی ئەم دەستونووسە کۆنانەوە. هەر ئەم هۆشیاریە بوو کە زۆرێك پێی دەڵێن زانستی نوێ. پیشەی چاپ یارمەتیدەرێکی چاك بوو بۆ ڕێنسانس. چینیەکان لە سەردەمی کۆنیش خەبەریان لە چاپ هەبوو، بەڵام ئەم سەنعەتە تازە لە ڕۆژئاوا گرنگی پێدەدرا. تا سەردەمی ئیراسموس چاپ لە هەموو شارە گەورەکانی ئەوروپا برەوی پێدرابوو. سەدان بەرگ کتێب چاپ کرا لە جیاتی ئەوەی دانە دانە کۆپیان بکەنەوە لە ڕێگای نووسینەوە. ئیراسموس ئەم دەرفەتەی قۆستەوە کە بیروباوەڕ و زانیاریەکانی خۆی لە گەڵ زۆر خەڵکانی دیکە لە ڕێگای چاپەوە بخاتە بەرباس.**

**خەڵکی دەیانەویست کتێبەکانی وەخوێنن. نووسینەکانی ئاسان و بە چێژ بوون، چونکە ئەو چاکی دەزانیّ کام ووشانە لە نوو سینەکانیدا بەکار بهێنێت. بیرێکی تیژی هەبوو و نوو سینەکانی شی سرنج ڕاکێش بوون. ڕاوبۆ چونی نوێ و زۆری لە بارەی خەڵك و کارەکانی سەردەمی خۆی لە هەنبانەدا هەبوو، زۆر جار گاڵتەی بە نەزانی و خۆبەزل زانی قەشەکان دەکرد.**

زۆری تەلاش کرد و چـەندین کتێبی نووسـی. بە درێژایی ژیانی چـاپی نوێی لە کتێبە کۆنەکان خسـتە ڕوو و خۆشـی چەندین کتێبی نووسین. بە هۆی ئەم کتێبانەوە نێوبانگی دەرکرد. زۆرێك لە زاناترین پیاوانی ئەوروپا و هەتا پاشاکانیش شانازیان بە ئاشنایەتی لە گەڵ ئەم پیاوە دەکرد.

## بیروباوەڕەکانی ئێراسموس

گرنگترین کاری ئەو ئەوەبوو کە زانسـت و لێهاتوەکانی لە لێك بەسـتنەوەی دوو عەقیدەی گرنگدا بە کار بهێنێت. ئێراسموس هەموو عەقیدەکانی لە کتێبی جەنگی سەربازێکی مەسیحی خستە ڕوو کە ئەم کتێبە بە هەموو زمانە گرنگەکان ئەوروپا تەرجەمە کرا و چـەندین جاریش لە چـاپ درایەوە. هەوەڵین بیروباوەڕی ئەوەبوو کە کەلیسـا بێ توانا بووە لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی، ئەویش لەبەرئەوەی کە قەشـەکان زۆر دونیاپەرەسـتن و بە سـەختی خەریکی دابو نەریت بوون. مە سیحیەتی ڕا ستەقینە بە هۆی پەرە ستشی سادەو خوێندنەوە بۆ ووتەکانی مە سیح و نوو سینە کۆنەکان، دەکرێت برەوی پێبدرێت.

ئەم بیروباوەڕە وای لێ کرد کە بەرەو بیروباوەڕی دووەم بچێت، واتە مەبەستی زانستی نوێ ئەوە نەبوو کە سرنج ڕاکێش و بە چێژ بێت. بەڵکو مەبە ست لە زاز ستی نوێ ئەوەبوو کە لە مەڕ بابەتی جیهانی کۆن و زمانەکانی ئەو سەردەمە کۆنانە زانیاری زیاتر وەدە ست بهێنن تاکوو مژدەکانی ( چوار ئینجیل) و نوو سینەکانی کۆنی مە سیحیەت زیاتر ڕۆ شن بنەوە. ئەو هەر لەبەر ئەم هۆکارە خۆی فێری زمانی یۆنانی کرد و سـوودی لەم عیلمە وەرگرت تا تەرجەمەیەکی نوێ بۆ (پەیمانی نوێ) بکات. چەندین کتێبی دیکەی لە نووسنەکانی مەسیحیەتی کۆن بڵاو کردەوە.

## کاریگەری ئێراسموس

زۆربەی خەڵك لە سەراز سەری ئەوروپا هومێدیان بەوە هەبوو کە ئەگەر شوێن بیروباوەڕەکانی ئێراسموس بکەون دەتوانن کەلیسا بگەڕێننەوە بۆ سەر ڕێگای ڕاست و تێیدا دەست بکەن بە چاکسازی کە زۆر پێویستی دەکرد. بەڵام ڕێك لەو کاتەی کە ئێراسموس گەیشـتبووە لوتکەی بەناوبانگ بوون، مارتین لۆتەر پەیدا بوو کە نەفرەتی هەبوو لە هەڵەکانی کەلیسـا، و هەوڵی دا کە یەکرێزی کەلیسا تێکبدا.

ئێراسموس لە سەرەتا پ شتگیری لۆتەری کرد. بەڵام کاتێك بینی لۆتەر بە توندڕەوانە کارەکانی دەباتە پێ شێ، ئێراسموس لێی کشـایەوە. ئەو هەروەها پشـتگیری لەو کەلیسـایانەش نەکرد کە دەیانهەویسـت لۆتەر وەدەرنێن و لە ناوی بەرن. ئێراسموس دەیهەویست کە مسیحیەکان لە گەڵ یەکتر لە خۆشەویستی بۆ خودا و لە ئا شتیدا بژین و یەکگرتوو بن. ئەوان ئەمەیان نەدەویسـت، هەر دوولا دژایەتیان دەکرد لەبەر ئەوەی ئەو پشـتگیری هیچـیانی نەدەکرد. ئێراسموس لە سـاڵی ١٥٣٦ کۆچی دوایی کرد، لە حاڵێکدا بە هۆی کەم چیکڵدانەیی چواردەورەکەی زۆر خەمبار و پەرۆش بوو.

## مارتین لۆتەر (١٤٨٣ تا ١٥٤٦)

مارتین لۆتەر

مارتین لۆتەر کوڕی کان هەڵکەنێك( کەسێك کە لە کان بۆ دەرهێنانی کانزا کار دەکات)ی ئەڵمانی بوو. مارتین لە دەرس و دەور زیرەك بوو هەر ئەوەی کە گەورە بوو باوکی هەناردی بۆ زانکۆ بۆ ئەوەی ببێتە پارێزەر. مارتین لە ساڵی ١٥٠٥، کە هەر چەند باوکیشی ناڕازی بوو، بوو بە موریدی ڕەببانەکان، کە کارێکی نائومێدانە بوو بۆ گەیشتن بە ڕزگاری. مارتین بە سەختی کەوتبووە ناو ترسە کە گوناهکارە و لەوەدەترسا بۆ هەتا هەتایە لە ئاگری دۆزەخدا دەسوتێ. ئەم دڵەڕاوکێیەی هەیبوو دەبوایە خۆی لێ ڕزگار بکات.

## گوناح و ڕزگاری

کەلیسا بەم جۆرە خەڵکی فێرەکردوو و لوتەریش وەکوو خەڵکی دیکە باوەڕی پێ هەبوو، کە خەڵکی هەموو گوناهکارن و بە گوناهکار لە دایك بوونە، چونکە زۆربەی جار ئەو کارانە ئەنجام دەدەن کە پێچەوانەی یاساکانی خودایە. گوناحکار دەبێت سزا بدرێت، لەبەرئەوە لە دوای مردن ڕۆحی تاوانباران دەنیردرێنە بەرزەخ. لەوێدا سزا دەدرێن بۆ ئەوەی تۆڵەی ئەو گوناهانەیان لێبکەنەوە کە لە زەویدا ئەنجامیان داوە. هەروەها کەلیسا دەیووت هەندێك لە خەڵکی تووشی گوناهی وا دەبنەوە کە هەرگیز خودا لێیان خۆش نابێت و بۆ هەمیشە لە جەهەنەمدا دەمێننەوە.

زیارەتکارانی سەدەی پانزەهەم. ئەم زیارەتکارانە بە جلو بەرگی ڕازاوە تازە لە کەشتی دابەزیوون و دەیانەوێ لە گەلچ هەیئەتێکی مەسیحی بەشداری بکەن.

**دیارە کە سزادان و لێخۆشبوون زۆر بابەتێکی گرنگە، بەڵام مرۆڤ چۆن دەتوانێ بگات بە ڕزگاری؟ کەلیسا بەم جۆرە وەڵامی ئەم پرسیارەی دەداوە. خەڵکی دەبێ هەوڵدەن بەوجۆرە بژین کە خودا دەیهەوێ، دەبێ هەمیشە تۆبە بکەن و دەبێ پەرەستشی خوا بکەن. کەلیسا پێداگری دەکرد کە یارمەتی داواکردن لە خودا لە هەموو کارێك پێویستە. قەشەکان**

**بەرەو سزا دەڕوون. کەلیسا فێری دەکردن بۆ ڕزگاربوون دەبێ خۆمان لە سزای هەمیشەی بپارێزین. لەم وێنەیەدا هەم فرمانڕەواکان هەن و هەم قەشەکانیش.**

**بە خەڵکیان دەگوت کە چلۆن دەبێ بژین، دان بە تاوانەکانیاندا بنێن، و عیبادەت بکەن. تەنها کەلیسا کلیلی جیهانی غەیبی پێ بوو. کەلیسا داوای لە خەڵك دەکرد نیشانی بدەن کە لە کردەوە تاوانەکانیان شەرمەزارن و دەبێ تۆبە بکەن و ئازاری جەستەیی ببینین، واتە دەست لە خۆڕازاندنەوە و خۆشی هەڵگرن و بچن بۆ جێگا پیرۆزەکان. بۆ هاندانی خەڵکی زۆربەی کەلیساکان یادگارییەك یاخود ئێسکەپەیکەری پیاو چاکانێکیان هەبوو کە خەڵکی ئاسایی چەندین میل ڕێگایان دەبڕی بێن بۆ زیارەتی ئەم شوێنە پیرۆزانە. دەرئەنجامی ئەم زیارەتە بۆ خەڵکی لێخۆشبوون و تۆبەی کاتی بوو لە گوناهەکانیان. ئەم لێخۆش بوون و تۆبەکردنە کاتیانە بۆ ئەوە بوو کە کەلیسا سزاکانیان وەدرەنگی بخات بەومەرجەی کە لە گوناهەکانیان تۆبە بکەن و پیشانی بدەن کە پەشیمانن. کەلیسا هەندێك جار بۆ لێخۆشبوون تۆبەنامەی بە خەڵك دەفرۆشت.**

**فرۆشتنی تەوبەنامە. ئەو پیاوەی لە ناوەڕاستی وێنەکەیە دەلاڵی سککەی نوێیە کە کڕین وفرۆشتنی پێدەکات بۆ خۆدەوڵەمەند کردن.**

ئەمانە وەڵامی کەلیسـا بوون و زۆر خەڵکیش باوەڕی پێیان هەبوو. بەڵام مارتین لۆتەر زۆر دڵخۆش نەبوو بەمە. گەرچـی گوناهکار نەبوو بەڵام نەیدەتوانی باوەڕ بکات کە خوداوەند تۆبەکەی لێوەرگرتووە. گەر چی چووبووە ناو خانەقاوە بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا هەستی ئەوەی نەبوو کە خودا لێی خۆش بووە. بۆ ئەنجامدانی کارێك کە خانەقا پێی ئەسپارد بوو ڕووی کردە ڕۆم، لەم ڕێگەیەوە توانی سـەردانی چـەند زیارەتگایەك بکات. ڕۆم، لە ئەوروپا، باشـترین کۆمەڵەی هەبوو. ئەم کۆمەڵەیە بانگە شەی ئەوەی دەکرد کە پار چەیەك لە بڕکەی سوتاو ( لە سیفری تەورات باس لەوە دەکات کە فریشتەی خوداوەند لە بڕکە گیایەك کە هەمووی ئاگر بوو خۆی بە موسی پیشان دا و کاتێك ئەو سەیری کرد ئیتر ئەم ئاگرە هیچی نەدەسوتاند) و یەك سککە کە یەهودا بە عیسی مەسیحی فرۆشت بوو لایەتی و هەروەها لاشەی پێترسی قدیس و پۆلس و سەدان شتی دیکەی سەیرو سەمەرەیان لایە. لۆتەر هێشتا هەستی لێخۆشبوونی خودای نەکردبوو بەڵام ئەو دونیاپەرەستیەی کە لە نێوان قەشەکان کە هەبوو لۆتەری هەژاند.

لە ساڵی ١٥١١ لۆتەریان نارد بۆ زانکۆیەی نوێ لە (وینتبرگ). ئەو بۆ دروست بە جێگەیاندنی ئەم کارە دەبوایە موتاڵای کتێبی پیرۆزی کردبایەوە. لێرەدابوو ئەو وڵامەی دۆزیەوە کە لێی دەگەڕا. لوتەر یەقینی پەیدا کرد کە تۆبەو لێخۆش بوون بۆ ئەوانەیە کە باوەڕی بەم یا سایەی مە سیحیەت هەبێ کە دەڵێ خوداوەند بە قوربانی کردنی کوڕەکەی (عیسا مەسیح) مرۆڤایەتی ڕزگار کردووە.

مەجلیسی وورمز. لەم وێنەیەدا لۆتەر لە دادگایە.

## ٩٥ بابەت

لە ساڵی ١٥١٧ ڕاهیبێك بە ناوی (جان تیتسێل) هات بۆ وینتبێرگ بۆ فرۆشتنی تەوبەنامە. قەول وابوو کە بەشێك لە پارەی ئەم بازرگانیە بنێردرێت بۆ پاپ بۆ ئەوەی کەلیسای پێترسی قدیس نۆژەن بکرێتەوە. لۆتەر ئەم تەوبەنامەیەی بە فێل و کلاوچیەتی ناوبردوو ٩٥ بەڵگەشی لە دژی تەوبەنامە دەرکردوو بە دەرگای کەلیسای هەڵواسی. دەیووت کەلیسا ئەو توانایەی نییە کە لە تاوانی خەڵك خۆش ببێت. بەڵام ئەگەر هەر مەسیحیەك کە بەڕاستی تۆبە بکات خوداوەند بەبێ ئەم تەوبەنامەیەش لێ خۆش دەبێت.

بەم هۆیەوە ڕوبەڕوبونەوەیەك لە نێوان لۆتەر و (جان ئیك) ڕویدا بۆ گفتوگۆ کردن لە سەر ئەو بابەتە. لوتەر ئەوەی پە سەند کرد کە باوەڕی ئەو لەســـەر ئەوەیە کە خەڵك دەبێ ئەوەی لە کتێبی پیرۆز دەیخوێننەوە باوەڕی پێ بکەن نەك ئەوەی کەلیسا دەیڵێ. هەروەها ئەم ڕووبەڕوبونەوەیە وای لێکرد کە وا بیربکاتەوە کە لە کەلیسا دابڕن. پاپ پەیامێکی بۆ نارد کە ئەو لە عەنایەتی خوداوەند واتە لە کەلیســـا، مەحروم کراوە مەگەر ئەوەی دان بە هەڵەکەی خۆیدا بنێت، بەڵام لۆتەر قەبوڵی نەکرد. لەپای ئەوەش پەیامەکەی لە بەرچاوی خەڵك سوتاند کە ناسرابوو بە پەیامی (فەرمانی دەرکردن).

## مەجلیسی وورمز

ئێ ستاکە لۆتەر تەواو لە مەتر سیدا بوو. بە درێژایی چەندین سەدە زۆرێکیان بە هۆی دژایەتی کردن لە گەڵ کەلیسا لە سێدارەدابوون. لەو کاتەدا ئیمپراتۆری نوێ چارڵزی پێنجەم ئەمری کردبوو بە درو ستکردنی شوڕای شازادەکان ( ئەم شوڕایە بە مەجلیس نا سرابوو) ئەم شوڕایە لە شاری وورمز سازکرابوو و لۆتەریش تێدا ئامادە بوو. ئامانجی لۆتەر ئەوەبوو کە پشتیوانی ئیمپراتۆر بۆ چاکسازی کەلیسا بەدە ست بهێنێ. بەڵام چارڵز ڕعیەتی کاتۆلیکی زۆری هەبوو و پێویستی بە هاوڕێیەتی پاپ هەبوو. هەروەها لە دڵەوە باوەڕی وابوو کە دەبێ پشتیوانی لە کەلیسا بکرێت. بە لۆتەریان ووت هەر چیت ووتووە پەشـــیمان بەرەوە. کاتێك ملی نەدا چـــارلز ڕێگای پێدا کە بڕوا، کە پێشـــتر قەولێکی وای پێدابوو، بەڵام دواتر لۆتەریان بە یاساشکێن و تاونبار ناساند.

بەرفراوانبوونی بزوتنەوەی چاکسازیی

## شازادە ئەڵمانیەکان

لوتەر، کە هەم کەلیسا و هەم ئیمپراتۆریش پشتیان تێکردبوو، تاکە شوێنێك کە دەیتوانی ژیانی پارێزراو بێت لە پەنا شازادە ئەڵمانیەکان بوو. هەندێك لە فەرمانڕەوا ئەڵمانیەکان نەیاندەویســـت گوێڕایەڵی ئیمپراتۆر بکەن، و ئەوانیش وەکوو زۆرێك

لە ڕەعیەتەکانی خۆیان، ڕەقیان لە دانی ماڵیات بوو بە پاپ و ئەو موڵکەی لە ئەڵمان کە لە ژێر دەستی کەلیسا بوو بە هی خۆیان دەزانی. هەر ئەمانە بوون کە پ شتوپانیان لە لۆتەر کرد بۆ ئەوەی کارەکەی خۆی بکات. ئەو ئەم کارەی بە هێرش کردنە سەر پاپ دە ست پێ کرد. کتێبی پیرۆزی تەرجەمە کردە سەر زمانی ئەڵمانی بۆ ئەوەی هەموان بۆ خۆیان بتوانن بیخوێننەوە، و نیشانی دا کە چاکسازی کەلیسا دەبێ چلۆن بێت.

لۆتەر خۆی وەکوو پاپی نوێ نەنا ساند. ئەو ئەم کارەی خ ستە ئە ستۆی فەرمانڕەواکان بۆ ئەوەی ببینن بزانن کەلی سا بە دروستی ئیدارە دەکرێ یان نا. ئەو پێی باش بوو کە کەلیسا دابەش بکرێت بۆ چەند بە شێك و هەر بە شەش بەڕێوەبەرێك بە پێی ویژدان و ڕێنمایەکانی کتێبی پیرۆز بەڕێوەی برێت.

تا کاتی مەرگی لۆتەر کە لە ساڵی ١٥٤٦ وەفاتی کرد، کەلیسا لۆتەریەکان لە دەرەوەی ئەڵمانیش لە وڵاتەکانی وەکوو سوێد و دانمارکیش گەشەی کرد. لۆتەریسم تەنها جۆری پرۆتسانیسم نەبوو ( پرۆتستانگری: ناڕازی) و ئەم پرۆتستانگەریەش ناوێك بوو کە کەلیسـای کاتۆلیکی ڕۆم دەیدا پاڵ ئەو بزوتنەوانەی کە لێی جودا دەبونەوە. کالۆنیسـم، کە لە ناوی (ژان کالۆنی) فەڕانسـەویەوە هاتبوو، لە سـویسـرا و فەڕانسـە گرنگیەکی زۆری هەبوو، وە دواتریش لە هۆڵەندا و سـکۆتلاند و ئەمریکای باکوریش گرنگی پێدرا.

لە گەڵ هەموو ئەمانە پرۆتە ستان لە هەموو شوێنێك سەرنەکەوت. زۆرێك لە کاتۆلیکەکان ڕووبەڕووی کەلی ساکانی خۆیان بوونەوە. یەکێك لە گرنگترینی ئەو کاتۆلیەکانە ناوی (ئیگناسـیۆس لوایولا) بوو کە لە نیوان سـالانی ١٩٤١ تا ١٥٥٦ ژیاوە.

ئیگناسیۆس لوایولا. دامەزرێنەری ئەنجومەنی مەسیحی. بەشێوەی گشتی لە ساڵی ١٥٤١ تا کاتی مردنی ڕێبەری ئەو ئەنجومەنە بوو.

## سەربازی ئیسپانیایی

ئیگناسیۆس لوایولا لە ئیسپانیا لە دایك بوو، بچوکترین منالای خێزانەکەیان بوو لە نێوان سێزدە منالّ. بنەماڵەی لوایولا یەکێك لە خێزانە هەژارەکان بەلام نەجیزب زادەی ئیسپانیایی بوون کە هەموو کارێکیان جگە لە سەربازی بە شەرمەزاری دەزانی. ئیگناسیۆس بەو شانازیەوە گەورە بوو کە ببێ بە سەرباز، بەو بۆنەیەوە خزمەتی بە پاشای ئیسپانیا دەکرد لە

**(ناوار)، ئەمەش ئەو پارێزگایە بوو کە فەڕانسە خۆی بە خاوەنی دەزانی. لە ساڵی ١٥٢١ فەڕانسیەکان هێرشیان کرد، و پامیلۆنایان گەمارۆ دا. گولە تۆپێك بەر ئیگناسیۆس کەوت و چەند شوێنێکی پێی شکا.**

**یەسوعیەکان کە بانگەوازی مەسیحیەت دەکەن لە ناو سوورپێستەکانی کالیفۆرنیا.**

**هومێدی بە چـــابونەوەی نەبوو: زانســـتی پزیشـــکی زۆر لاواز بوو و ئازارەکانیشـــی زۆربوون. بەڵام ئیگ ناســـیۆس لە ڕووی ڕوحیەو زۆر بە هێز بوو هەر ئەمەش بوو وای لیّ کرد لەو دەردەی کە چـــەندین هەفتە پێوەی دەناڵاند ڕزگاری بێت. بۆ ئەوەی کە کات بەسەربەرێ هەندیّ کتێبی نویّ کە هەیبوون خوێندنیەوە. هەندێك لەم کتێبانە لە بواری ســوارچــاکی بووکە زۆری حەز لیّ بوو، هەندێکیش لە بارەی ژیانی قدیســـەکان بوو. کەم کەم بۆی دەرکەوت کە ژیانی قەدیسەکان ئارامی و شادی پێدەبەخشیّ تا سوارچاکە ئازاکان. شـــوێك لە خەوا مەردیەمی موقەدەســـی بینی لە گەڵچ عیسای بچووك لە باوەشیدا و دڵنەوایان کرد و هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئیتر واز لە دنیا پەرەستی بهێنیّ. ڕنج و ئەو هاوکاریەی کە دین پێی کردژیانی ئیگناســوس بە تەواوی گۆڕانی بەســەر هات. ئێســتاکە دونیای بە مەیدانی جەنگی نێوان خودا و شەیتان دەبینی و دەیوست لە خزمەت خوداوەند دابێت، بەڵام چۆن؟**

**سەرەتا زۆربەی کاتی خۆی بە خواردن و خەوتن و تۆبە و تاعەت بە سەر برد، بەڵام بە هۆی ئەم کارەوە نەخۆش کەوت و هیچـــی گیرا نەبوو. چـــوو بۆ زیارەت لە ئورشـــەلیم بەڵکو لەویّ یارمەتی خەڵك بدات، بەڵام ئەو کات تورکەکان ئەوێیان گرتبوو و ئیزنی نیشـــتەجیّ بوونیان لەویّ پیّ نەدا. ســـەرەنجام بڕیاری دا زانســـت بخوێنیّ: هەرچـــەند زۆرتری زانیبا زیاتر دەیتوانی خزمەت بە خوداوەند بکات. دوانزە ساڵ دەرسی خوێند، سەرەتا لە ئیسپانیا، دواتر لە پاریس. لەوکاتەدا خۆی لە هەژاریدا دەژیا، بەڵام هاوکاری هەژار و نەخۆشـــەکانی دەکرد، و لەوێدا شـــوێنکەوتوشـــی پەیدا کرد کە ئەوانیش ئەم کارەیان دەکرد.**

## ئەنجومەنی عیسا

ئیگنا سیۆس لە ساڵی ١٥٤٠ هانی پاپی ئەدا کە کەلیسا پێویستی بە ئەنجومەنێکی نوێ هەیە بەناوی ئەنجومەنی عیسا، کە بەڕێوەبەرکەشـــی بۆخۆی بوو. ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە بە یەســـوعیەکان (ژزوئیت) ناســـرابوون، زۆر بە ووردی ئەو ئەندامانە هەڵدەبژێردران، و ئەو ئەندامانەش بە پێی ئەو پەیڕەوانەی کە لە کتێبی ڕاهێنانەی ڕۆحیەکاندا هەبوون پەروەردەیان دەکردن، ئەو کتێبەش هەر خودی ئیگنا سیۆس نوو سیبووی. ئەو ئەندامانە زیرەك و بیرێکی تیژیان هەبوو، و سوێندیان خواردبوو کە بە تەواوی گوێڕایەڵی ئیگناسیۆس و پاپ بن. ئەوان ئامادە بوون هەر کارێك بکەن و خۆیان بخەنە ناو هەر مەترسیەکەوە تەنها بۆ ئەوەی خەڵکی بهێننە ناو ئاینی کاتۆلیکەوە.

هەندێك لە یە سوعیەکان، وەکوو ( سەن فراز سیس)، چوون بۆ هیند و هیندی ڕۆژهەڵات و هەتا ژاپۆن و چین بۆ ئەوەی مەسیحیەت بگەیەننە ڕۆژهەڵاتیش. ئەم جۆرە کەسانە ئازاری زۆریان لەم ڕێگەیەدا بینی و هەندێك پێشرەویشیان کرد بەڵام ئەوەندە زۆر نەبوو. زۆرێك لە ڕۆژهەڵاتیەکان لە مەڕ بیری عەقیدەی خۆیان زۆر خۆشبین بوون و دەستیان لە ئایینی خۆیان هەڵنەدەگرت.

باقی یە سوعیەکانی دیکە چوون بۆ ئەمریکا بۆ ئەوەی سوورپێ ستەکانی ئەوێ بکەنە مە سیحی، و لە بەرامبەر داگیرکارە ئەوروپیەکان بیانپارێزن، چـــوونکە ئەوروپیەکان زۆرجار بە توندی ڕەفتاریان لە گەڵ ئەم ســـوورپێســـتانە دەکرد. کۆچ کردنێکی زۆر ڕوویدا لەو کیشـــوەرە، و ســـوورەپێســـتەکانیش بە هۆی یەســـوعیەکانەوە زانیاریان لە ئایینی مەســـیحیەت بەدەستهێناو و ڕێگاکانی چاندن و دروێنەش فێربوون.

ئینگزیسیۆن. ئەوانەی عەقیدەی کاتۆلیکی ڕۆمیان پەسەند نەدەکرد سزا دەدران و هەندێك جار دەسوتێندران.

## دژایەتی کردن لە گەڵ چاکسازی

کاری یەسوعیەکان لە ئەوروپا جیاواز بوو. ئەوان بە ڕێبەرایەتی ئیگناسیۆس خۆیان تەرەخان کردبوو بۆ پشتگیری کردن لە کەلیسای کاتۆلیك و پاپ. لە شورایەکی گەورەی کەلیسا واتە شورای (ترانت) زیاتر لە هەموان شوێنکەوتووە کاتۆلیکەکانی خۆیان هان دەدا کە بیروباوەڕی پرۆتستانتی ڕەد بکەنەوە. هەندێك لە قەشە یەسوعیەکان بوون بە ڕاوێژکاری شازادەکان، و هانیان دەدان بۆ ڕووبەڕووبونەوەی پرۆتستانگەرایی. هەندێکی شیان چوون بۆ وڵاتانی پرۆتستانت بۆ ئەوەی دڵگەرمی بدەن بەو کەسانەی کە لە سەر باوەڕی کاتۆلیکی مابوونەوە. لە گەڵ هەموو ئەمانە ئەوانەی کە لە قوتابخانە یەسوعیەکان وانەیان دەخوێندو کتێبەکانی ئگناسیۆس دەوترایەوە لەوێدا، بوون بە باشترین یەسوعیەکانی ئەوروپا.

یە سوعیەکان کە خولیای ڕزگاری ڕۆحی خەڵکی بوون هەندێك جار ڕەفتاری نا شیرینی خەڵکیان لەبەر چاو نەدەگرت کە ئەوەش بە سوودی خۆیان تەواو دەبوو، لە گەڵ ئەوەشدا لە سەر ئەو هەمووە کارە سەختانەش کە دەیانکرد کاتۆلیکەکان و پرِرتستانەکانیش زۆریان باوەڕ پێ نەدەکردن.

دژایەتی چاکسازی هەمووی پەیوەست نەبوو بە یەسوعیەکان. ئەنکیزیسیۆن یاخود (دادگای لێکۆڵەری عەقیدەی)، ئەرکیان لە ڕیشە هەڵکەندنی بیری کفری بوو واتە ئەوانەی کە کاتۆلیکیان قەبوڵ نەبوو، ولەم نێوانەدا دە سەڵاتێکی زۆریان هەبوو. (ئەنیدکس) یان لیستی ڕەش زۆر گرنگ بوو. لیستێك بوو کە ناوی ئەو کتێبانەی تێدابو کە خوێندنەوەیان یاساخ بوو. ئەم لیستە کتێبەکانی لۆتەر و ئیراسموسیشی تێدابوو.

بە گشتی، لە سەراذسەری ئەوروپای کاتۆلیك هەوڵ دەردا کۆتایی بە نەزانی و ڕەفتارە نا شیرنەکانی قە شەکان بهێنرێت. لەم نێوانەدا سنووردارکردنی پێشڕەوی پرۆتستانتیشی گرتەوە.

## کاریگەری ژان کاڵۆن

ژان کاڵۆن

لە ساڵی ١٥٤١ دانیشتوانی ژنێڤ دەسەڵاتی تەواوی ئیدارەی ئەو شارەیان دایە دەستی کاڵۆنی فەرانسی. ووتەکانی کاڵۆن ئەمە بوو کە دەیووت خوداوەند لە پێشتردا دیاری کردووە کە چ کەسانێك لە نەعلەتی خودا ڕزگاریان دەبێت. دیارە ئەو کەسانە، کەسانێك بوونە کە چاکەکاربوونە و کاری چاکەیان کردووە. لەبەرئەوە شار وای لێهاتبوو ببوو بە شامی شەریف کە ماموستا و دادوەر وهاوسێ و هەموویان پێکەوە دەگەڵ یەك چاك ڕەفتاریان دەکرد و یەکتریان هان دەدا بۆ چاکە کردن.

ژنێڤ لە ژێر فەرمانڕەوایی دەقیق و سەختگیرانەی کاڵۆن یەکێك بووە لە گرینگترین ناوەندەکانی پرۆتستانیزم لە ئەوروپا. زۆرێك لە چاکسازی خوازەکان لە هەموو وڵاتان دەنێردران بۆ ئەوەی لەوێ بخوێنن، بەتایبەت فەرانسە، هۆڵەند و بەریتانیا و دواتر دەهاتنەوە سەر بیروباوەڕی کاڵۆنی.

هەندێك لە مێژوونووسان پێیان وایە کە کاڵویسم لە گەشەی بازرگانی و پیشەسازی دەستی باڵای هەبووە. ئەوان وا بیریان دەکردەوە وەك ئەوەی بڵێی کاڵۆنیستەکان باوەڕیان بە ڕزگاری خۆیان لە لایەن خوداوە نەبوو. لەبەرئەوە زۆر بە سەختی کاریان دەکرد بۆ ئەوەی لەم دونیایە سەرکەوتوو بن و قەناعەت بە خۆیان بهێنن کە لە ڕزگاربوانن.

لە دوای بزوتنەوەی چاکسازی، بازرگانی و پیشەسازی لە هۆڵەند و بەریتانیا بە خێرایی گەشەی کرد، کاڵۆنیسم لە هەردوو لەم وڵاتانە کاریگەری گەورەی هەبوو. ئەمە ئەوە نیشان دەدا لەم بوارەوە لەوانەیە حەقیقەتێکی شاراوە هەبێ. بەڵام ئەمە بیردۆزێك نییە کە بکرێ بە ئاسانی بسەلمێنرێت. هەندێك بەڵگەی دیکە هەن کە ڕەنگە بکرێت سەرکەوتنی هۆڵەند و بەریتانیا لەم ساڵانەدا ڕوون بکرێتەوە. (بگەڕێوە بۆ شۆڕشی پیشەسازی لەم زنجیرەیە)

## گرنگی بزتنەوەی چاکسازی

چاکسازی و دژە چاکسازی، لەوەڕا پەیدا بوو کە نەك تەنها لە ئایینی مەسیح، هونەر، و زانست، بەڵکو لە مێژووی ئەوروپا و جیهانیش گرنگی هەبوو.

شاری ژنێڤ له ساڵی ١٥٥١. کاڵۆن ئەم شارەی گۆڕی بۆ گرنگترین ناوەندی پرۆتستانتیزم له ئەوروپا.

## دین، هونەر و زانست

**کەلیسای مەسیحی له ئەوروپای ڕۆژئاوا هەرگیز نەیتوانی چارەسەری ئەو لێك جیابوونەوانه بکات که به هۆی بزوتنەوەی چاکسازیەوه دەستی پێکردبوو. کەلیسا جیاوازەکان هەر یەکەیان لەسەر ڕێچگای خۆیان بەردەوام بوون. له دوای ئەوەی که زانیان به زۆر و توندوتیژی هیچیان پێ ناکرێ، ئیتر له سەر یەکخستنەوەی ئەم لایەنانه پێداگریان نەکرد که بەر له سەدەی شانزەهەم به پێویستیان دەزانی.**

**دژایەتیەکانیان له سەر کاریگەری هونەر ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو، کاتۆلیکەکان، به تایبەت یەسوعیەکان، دەیانهەویست هونەر وەکوو پێشتر بەکاربهێنن، واته به هۆی هونەرەوه هەستی خەڵکی ببزوێنن. کەلیساکانی کاتۆلیك له ڕووی جوانکاری و ڕازاندنەوه زیاتر له پێشتر دەوڵەمەندتربوون، به هۆی وێنه و نەقاشی و پەیکەری جوان. له لایەکی دیکەوە، پرۆتستانەکان گومانی خراپیان هەبوو بەم شتانه، بۆنموونه باوەڕیان وابوو که یەك پەیکەری جوانی حەزرەتی مەریم، دایکی حەزرەتی عیسا، دڵی خەڵکی له خودا دوور دەکاتەوه. لەبەرئەوه ئەوان هەوڵیان دەدا که ناوەڕۆکی کەلیساکانیان زۆر ساده بێت، هەندێکیان وایان لێهات ئەو پەیکەرانه بشکێنن که پێشتر له کەلیساکان دروستیان کردبوون. وێنەکێشانی وڵاتانی پرۆتستان کەمتر گرنگیان به وێنەی بابەته ئاینەکان دەدا بەڵام خویان دایه کێشانەوەی وێنەی دەموچاو و سروشت.**

**کەلیسای عیسا لە ڕۆم. ڕزاندنەوەی ناوەوەی ئەم کەلیسایە بۆ هەستی خەڵکی ڕاکێشن بۆ دینداری.**

**کاریگەری چاکسازی لە شۆڕشی زانستی کەمتر بەرچاوە. هەم کاتۆلیەکان و هەم پرۆتستانەکانیش لە سەرەتادا پشکێکی باشیان لەمە هەبوو، بەڵام دواتر بە هۆی گومانەکانی ئینکزیسیۆن ڕێگری هاتە بەر دەم کاتۆلیەکان، لەوانە دەکرێ ئاماژە بکەین بە داداگایی کردنی گالیلە کە بە کوفر تاوانبار کرابوو و لە  ساڵی ١٦٣٢ دادگایی کرا. ( بگەڕێوە بۆ  شۆڕ شی زانستی لەم زنجیرەیە)**

## جەنگە ئاینیەکان

**دژایەتی قوڵی ئایینی بزوتنەوەی چاکسازی گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە زۆرێك لە ژێر ناوی خودا دەستیان بە خوێنی یەکتر سوور بوو و دەستیان دایە کوشتای یەکتری. پاشاکان و شازادەکان لە ژێر ناوی دین دەسیان کردە ماڵوێرانکردنی یەکتر، لەبەرئەوەی هەردوولایان دەیانهەویست دەسەڵات و سامانی کەلیسا بۆ خۆیان بێت. ئیمپراتۆر چارڵزی پێنجەم بە هاوکاری شازادەکانی کاتۆلیك لە گەڵ شازادە پرۆتستانتەکان دەستیان دایە جەنگ لە دژی یەکتر. کوڕەکەی، فلیپی دووەم، دەستی کردە جەنگ دژ بە پرۆتستانتەکانی هۆڵەندی و ئینگیزی. حاکمەکان داوایان لە ڕەعیەتەکانی خۆیان دەکرد ئەم ڕێگەی ئەمان بگرنە بەر. دین و سیاسەت زۆر بە سەختی تێکەڵی یەکتر بووو.**

**زۆرێك لە خەڵکی-واتە جوتیارەکان و کرێکارەکان، گەیشتنە ئەو فکرەی کە ئێستا نەك هەر لەکاروباری ئایینی بەڵکۆ لە کاری سیاسیش ئازادن خۆیان بڕیاربدەن و کۆمەڵگایەکی نوێ دروست بکەن. نەچوونە ژێر باری فەرمانەکانی فەرمانڕەواکان. خوێنێکی زۆر ڕژا بەتایبەت  لە فەڕانسە کە پرۆتستانت و کاتۆلیکەکان لە گەڵ یەك دەجەنگان، و هەروەها لە هۆڵەندیش. پرۆتستانتەکانی هۆڵەندا دوای چەند ساڵ جەنگ، لە ئیمپراتۆری کاتۆلیکی، فلیپی دووەم جیا بوونەوە.**

**ئیمپراتۆر، چارڵزی پێنجەم. وەکوو گەروەترین پلەی فەرمانڕەوای لە ئەوروپا باوەڕی وابوو کە ئەرکی ئەوەیە بە سوودی کاتۆلیك بجەنگێت.**

**ئەم جەنگە ئاینیانە زۆر بە قازانجی تورکە عوسمانیەکان بوو کە موسڵمان بوون. لەبەرئەوەی لە سەدەی شانزەهەم ماوەیەك وادەبینرا کە بە هۆی ئەم تەفرەقەو جیابونەوانە دینێکی دیکە باڵ بەسەر ئەوروپادا دەکێشێ، بەڵام لە کۆتایدا ئەوروپا بە ڕێژەیەکی پێویست بە هێز مایەوە کە پارێزگاری لە خۆی بکات.**

**چاکسازی و دژەچاکسازی بەرفراوانی خێراییان دایە دینی مەسیحیەت لە دەرەوەی ئەوروپا . بۆنموونە چەندین موستەعمەرەی بەریتانیایی لە ئەمریکای باکوور دەستی پێکرد، دەیانهەویست خەڵکی وێش وەك خۆیان پەرەستشی خودا بکەن. هەروەها، وەکوو ئەوەی دیومانە، یەسوعیەکان لە ئەمریکای باشوور و ئاسیا سەرقاڵی بانگخوازی بوون، و بانگخوازە پرۆتستانتیەکانیش وەرێکەوتن بۆ کێبڕکێ کردن لە گەڵ وان. ڕکابەرایەتی ئەم دووانە هەمیشە ئەنجامێکی باشیان نەبووە.**

**لە ڕاستیدا، تا کۆتایەکانی سەدەی حەڤدەیەم، زۆربەی خەڵکی لەوە تێگەشتن کە ناتوانن بە زۆر دینی خەڵك بگۆڕن. شێنەی لە بیروباوەڕی خەڵکی زیادی کرد و بەم جۆرەش دەرگا بۆ بیروباوەڕی بێ دینیش ئاواڵا بوو. مەسیحیەت کە بە هۆی بزوتنەوەی چاکسازی و دژە چاکسازی هەژێنرا و ژیانێکی نوێ وەرگرتبوو، بەڵام هەروەك هێزێکی گەورە لە جیهاندا مایەوە.**

